

# بۆ زانایان و
# خوێندکارانی زانستی شەرعی
# وپەروەردەکاران

## چەند وەسیەت وچەند
## کۆسپێکی سەر ڕێگا




ڕەحمەتی خوای لێبێ

**أبو عمر السيف**

بە پێنووسی شێخ

بۆ زانایانو خوێندکارانی زانستی
شەرعی وپەروەردەکاران

# چەند وەسیەتو
# چەند کۆسپێکی سەر ڕێگا

بە پێنووسی شێخی موجاهید وشەهید إن شاء الله
أَبُو عُمَر مُحَمَّد بنُ عَبْدِ اللهِ السَّيفْ

بەرپرسی شەرعی ئەنجومەنی شوورای سەربازی چیچانو
سەرۆکی دادگا شەرعییەکانی چیچانو
قوتابی پێشووی شیخ اِبنُ عُثَيْمِين – ڕەحمەتی خوای لێبێ



پێگەی ئیسلامی گزنگ
@Gizing_Net

# پێڕست

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

بۆ زانایان وخوێندکارانی زانستی شەرعی وپەروەردەکاران :-

دیارە کە پیادەبوون ومانەوەی دین وئاین وسەرکەوتنی بەو کتێبە ڕێنیشاندەر وشمشێرە پشتگیرەیە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێتو بۆمان باس دەکات: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾[١]– ئێمە پەیامبەرانمان بە ئایەت وبەڵگەی ڕوون وئاشکراوە هەنارده کردووە، کتێب وتەرازوومان دەگەڵ ناردوونەتە خوار خەڵك لە نێو خۆدا بە دادپەروەری هەڵسن، ئاسنیشمان هەناردۆتە خوار هێزێکی بە تینی تیایەو سوود وبەهرەی زۆریشی بۆ خەڵك هەس، تا خواش بزانێ ئاخۆ کێ لە پەنهاندا خۆی وپەیامبەرەکانی سەردەخات، بە ڕاستی خوا بە هێزی باڵادەستە.

هەر ئەمەش ئەو ڕێبازەی هاوەڵانی پەیامبەر بوو ﷺ کە دەستیان بە کتێب وجیهادەوە قایم بوو؛ هەر ئەوەش بوو کە سەرکەوتن وتەمکینی لە ئەرزا بۆ بەرقەرار کردن، کە خەڵکانێکی کامڵ ئیمان وئەهل وخاوەنی کار وکردەوەی چاك وپاراو بوون، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا

---

١ الحديد: ٢٥

يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ [١] - خوا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بە ڕاستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دین وئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی ڕازییە، هەروەها ترس وبیمیان بۆ بە ئارامی و هێمنی دەگۆڕێتەوە، ئەو کاتە ئیتر بە تەواوی هەر من دەپەرستن وهەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ وشەریکێکم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەداریە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە تاوانبارو لە سنوور دەرچوون.

کە خەڵکانی دواییش پەیوەست بوونیان بەو کتێب وجیهادەی خوای پەروەردگار ئەمری پێکردوون لاواز بوو، بە ئەندازەی پابەند نەبوونیان بە کتێب وجیهاد کردنەوە لە پێناو خوا - سبحانە وتعالی - تەمکین وهێز ودەسەڵاتیان لەدەست چوو.

..

جا لێرەدا یەکێك لەو دیاردانەی هۆکار بووە لە لاوازی وشکانی ئوممەتدا وسیفەتێکی کۆمەڵ ودەستەی سەرفراز وسەرکەوتووی ئوممەتی پێ لە جێ دەرچووەو، ئاسەواری خۆی بووە لە جوێ کردنەوەی زانست وجیهاد لە یەکەوە؛ کەم بەشدار بوونی شەرعناس وخوێندکارانی شەرعە لە خاك ومەیدانی جیهاد دا.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "لَا تَزالُ طائِفةٌ مِن أُمَّتي يُقاتِلونَ عَلى الحَقّ ظاهِرينَ إِلى يَومِ القِيامة" [٢]- هەمیشە کۆمەڵێکی ئوممەتم دەمێننەوە شەڕ لەسەر حەق دەکەن زاڵن تا هاتنی ڕۆژی قیامەتەوە.

---

١ النور: ٥٥

٢ (صحيحى مسلم ١٩٢٣)

دەروانی هەرگا ئالای جیهاد لە ئەرزێکا هەڵکرا، موجاهیدان پێشبڕکێی ئەوەیانە ئاخۆ کێ زووتر پێ لەسەر ئەرزی جیهاد دا بنێت وئاواتی ئەوە دەخوازن لە شوێنی خۆیدا مەرگ وکوشتنیان ببێتە نسیب.

بەڵام شەرعناس وخوێندکارانی شەرعییان تیا نادۆزیتەوە بێن فەرزی کیفایەتی فێرکردن وهۆشیارکردنەوەی موسوڵمانان وئاڕاستەکردنیان لە خاکی جیهاد بگرنە ئەستۆ، وسەدای پرس ودۆسیەی موسوڵمانان بن لە گوێچکەی ئوممەت دا، بەڵکو بڕێك لەو کەسانەی بە زانست وشەرعەوە ناسراون بەس نییە کە دانیشتوون ودەستیان لە جیهاد کێشاوەتەوە، تا ئەوەی دوورتر ولەوە خراپتر دەکەونە ساردکردنەوەی موسوڵمانان لە جیهاد وبەرگری دوژمنان وداگیرکەرانو، کە دەروانی هەواڵ وباسی ورە شکێن وتۆقێنەر لە نێو کۆمەڵی موسوڵماناندا پەخش دەکەنەوە ودوژمنیان لەبەر چاو گەورە دەکەنەوە.

ئەم بووژانەوەو نوێگەرییە جیهادییەش وتازەکردنەوەی فەریزەتی جیهاد - کە ئەمڕۆ ئوممەتی ئیسلامی تیایە -، بە ڕاستی هەلێك بوو بۆ ئەهلی زانستی ڕاستگۆ ڕوو لە هیجرەت وجیهاد لە پێناو خوای پەروەردگار بکەن ولە پێشەنگێتی ئوممەتدا بنو، هەوڵدەن بۆ ئەوەی دینی خوای پەروەردگار لە زەمین دا بەرقەرار بێت، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[1]- هەر کەس لە ڕای خوادا کۆچ وهیجرەت بکا، زۆرێکی جێ لەم زەمینەدا بۆ پەیدادەبێ ڕقی دوژمنانی خوای لێ هەڵسێنێت وداخ بخاتە دڵیانۆ وحەوانەوەو فەرحانی لە زەمین دا چنگ دەکەوێ، هەرکەسێکیش لە زێدی خۆی دەربکەوێو لە ڕێی خوداو پێغەمبەری خودادا دەربەدەربووبێو لە ئاوارەییدا بمرێ، خودا بۆ خۆی دەستەبەری پاداشیەتیو خوا لە گوناهان دەبووریو دلۆڤانە.

[1] النساء: ١٠٠

خوای پەروەردەگار بانگێشتی بەدندەکان دەکات وهانیان ئەدا ، بەرچاو ڕۆشنیان دەکاتەوە کە مرۆڤی کۆچبەر وموهاجیر بێ گومان لە هیجرەتەکەیدا شوێنێکی دەس دەکەوێ گورز لە دوژمنانی خوای پەروەردگار بوەشێنێت وڕقیان لێ هەڵسێنێتو، لە هەمان وەخت وجێگەش دا لە ڕزق وڕۆزی خوای پەروەردگار بێ بەش نییەو خێر وبێری پەروەردگاری دەگاتە دەست، ئەمەش بۆ خۆی تەواوی ماناو ڕووەکانی خۆشی وشادی وگوزەران دەگرێتەوە، هەر لە ڕۆحەوەو بازبوونی دەرگاکانی ڕەحمەت وخێر وبەرەکەتی، وەك خێر وڕەحمەتەکانی هیدایەت وبانگەواز وجیهاد وشەڕ وڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی پەروەردگار .. ئینجا کرانەوەی دەرگای ڕزق وڕۆزی هەمەڕەنگ وجیاواز، ودوورکەوتنەوەی نەفسی مرۆڤ لە غەم وپەژارەو وئەو نارەحەتی ودەردەسەری وبەڵایانەی بە نزیکی مرۆڤ لە ستەمکارانی دوژمنی خوای پەروەردگار ومانەوەی لە ژێر دەسەڵاتیان دا تووشی دێن، کە ناتوانێ یەکخواپەرستی وشەریعەتی پەروەردگار بەرقەرارکات ولە مەیدانیدا دەسبەسراو دەمێنێتەوە، تا دەگەیتە نیعمەت وڕەحمەتی دووری لە بت وتاغووتە مورتەدەکان ویاسا دەسکردەکانیان کە وڵات وخەڵکی پێ دەبەنە ڕێوە، ئیتر نیعمەتی ڕزگاربوونی لە تەسکی ونارەحەتی وزەلیلی وبێ دەسەڵاتی وسەرشۆڕی ژێردەستی طاغووتان وزوڵم وستەمیانو، گەیشتن بە ژیانی عیزەت وهێز وجیهاد ودەسەڵات وتەمکین لە زەمیندا.

دیارە زانایانیش میراتگری پەیامبەرانن، هەروەك چۆن ئەوان شارەزای میراتی پەیامبەرێتین، ئاواش پێویستە وەك پەیامبەران پەیام وبانگەوازیان هەڵگرنو، لە پێناو سەرخستنیدا جیهاد بکەن وتێکۆشنو، لە ئەزیەت ونارەحەتییەکانی گەیاندنی ئەم دین وپەیامەدا ئارامگر وبە سەبر بنو، پێشەنگی ئوممەت بن لە جیهادی دوژمناندا.

**ئەهلی زانستی ڕاستگۆش کۆمەڵە خووڕەوشت وسیفەت ونیشانەیان هەن کە لە زانای بەد وخراپیان جوێ دەکەنەوە:**

## یەکەمی ئەو سیفەتانە؛

**ئەوەیە کە زانا کار بە زانستی خۆی بکاتو گوفتار وکردارەکانی تێكبکەنەوە:**

بەندە وەك پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: "ما تُزالُ قَدَما عَبدٍ يَومَ القِيامَةِ حَتّى يُسْأَلَ عَن أربَع: عَن عُمُرِهِ فيما أَفنَاه ؟ وَعَن شَبَابِهِ فِيما أَبْلاه ؟ وَعَن مالِهِ مِن أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَه ؟ وَعَن عِلْمِهِ مَاذَا عَمِلَ فِيه ؟" [١]- قاچی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەولاو ئەملای پێ ناکرێ ولە مەوقیفی حسێب تێپەڕ نابێ تا پرسیاری دەربارەی چوار شتەوە لێ نەکرێت: تەمەنی لە چیدا بەسەربردووەو ؟ گەنجێتی لەچی دا گوزەراندووەو ؟ ماڵ وسامانی لە کوێوە بەدەست گەیشتووەو لە کوێدا سەرفی کردووەو ؟ زانست وزانینی چۆن بە کاربردووەو چی لێکردووە ؟

کە تێی سەیری سوورەتی فاتیحە دەکەیت دەبینی کە ڕێنموونی وهیدایەتی زانست وکردار واتا عیلم وعەمەلی پێکەوە لە خۆدا گرتووە، کە ڕێگەو ڕێبازی ئەو مەردمەیە کە کەوتوونەتە ژێر نیعمەت وبەخششی خوای پەروەردگار، پەیامبەران وڕاستگۆ وشەهید وپیاوچاکان، نە ئەوانەی ڕق وقین وغەزەبیان لێ گیراوە، کە زانای بێ کرداری وەك نموونەی جوولەکەو زانایانی موسوڵمانی فاسیق ولە ڕێلادەرن، نە ئەو گومڕایانەش کە کار وعەمەل بێ زانین وزانستێکی دروستەوە دەکەن، وەك مەسیحی وعابیدە نەزانەکانی ئەم ئوممەتە.

سُفيانُ بنُ عُيَيْنَة - ڕەحمەتی خوای لێبێ - دەفەرمێ: (مَنْ فَسَدَ مِن عُلَمَائِنا كانَ فِيهِ شَبَهٌ مِنَ اليَهود، وَمَن فَسَدَ مِنْ عُبَّادِنَا كانَ فِيهَ شَبَهٌ مِنَ النَّصارى) - هەر زانایەکمان لە ڕێی لادابێت ولەسەر

---

١ (المعجم الكبير للطبراني: ١٥٩٢٥)

ڕێبازی ڕاست نەمابێ برێك لە یەهوودی کردووەو، هەر خواپەرست وعابیدێکمان لایدابێ لە ڕێ وڕێبازی ڕاست برێك لە مەسیحییەکانی کردووە.

لە قورئانیشدا خوای پەروەردگار ئەم دوو پۆلەی بە یەکەوە باسکردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ۗ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ [١]- ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ! مەلا چاکو ڕەبەنەکانی ئەوانە، بەشی زۆریان - لە هەوانتەو بە ناحەق - ماڵی ئەو خەڵکە دەخۆنو بەرهەڵستی ڕێباز وئاینی خوا دەکەن. ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆدەکەنەوەو لە ڕای خودا بەختی ناکەن، مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان بدەرێ.

بۆیە ڕێنموونی وهیدایەت؛ ئەوەیە مرۆڤ کار بە عیلم وزانستی خۆی بکات وئامۆژگارییەکانی دینەکەی وەرگرێ وسوودمەند بێ لێیان، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ۞ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ۞ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ۞ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا﴾ [٢]- ئەگەر ئێمە بۆ ئەمانەمان نووسیبا، کوشتاری خۆبەخۆ بکەن یان لە وڵاتوو دەرکەون - کەمیان نەبێ - نەیاندەکرد. کەچی ئەگەر وەکوو نەسێحەتیان دەکرا وایان کردبا، بۆ ئەوان چاکی دەهێناو دامەزراوترو چەسپاوتر دەبوون لەسەر حەق و ڕاستی ۞ ئەوسا ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە پاداشێکی مەزنمان بەوان دەبەخشی ۞ بە تەواویش هیدایەت وڕێنموونی ڕێبازی ڕاست ودروستمان دەکردن ۞ هەرکەسێکی

---

١ التوبة: ٣٤

٢ النساء: ٦٦ - ٦٩

بەرفەرمانی خوداو ئەم پێغەمبەرە بێ، دەبێتە هاوڕێی ئەوانەی خودا چاکەی دەگەڵ کردوون؛ لە ڕیزەی پێغەمبەرانو خودا پەرستانی ڕاستیو شەهیدانو پیاو چاکەکان؛ چ هاوڕیانێکی چاکیشن ئەمانە !

زاناو شەرعناسیش کە خۆی بە شوێنکەوتەی پێشین وسەلەف بزانێت، کەچی لەولاوە قسەی حەقی لێوە نەبیستریێت وداپۆشێت وپشتی لە جیهاد بێو، کۆسپێك بێ لەسەر ڕێگەو ڕێبازی پەروەردگاردا .. چاوی لە بەش وعەرەزی دونیا بێ، دیارە کە ڕاستی نەکردووە، بەڵکو پتر لە زاناکانی یەهوود ئەچێت، کە غەزەب وقینی پەروەردگاریان لێ گیراوەو، خوای پەروەردگار کە وەسفی کردوون فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ ۝ أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ [١] - نەکەن ڕاستی و بەتاڵ، حەق و ناحەق بەیەکەوە بئاڵێنن و حەق مەشارنەوە، درۆ دامەپۆشن بەڕاست لەکاتێکدا خۆشتان حەق و ڕاستی دەزانن کامەیە ۝ نوێژ بکەنو زەکات بدەن؛ دەگەڵ کڕنۆشبەرەکاندا کڕنۆش بەرن ۝ (کەی ئەوە ڕاستە) فەرمانی چاکە بەخەڵکی بدەن و خۆتان فەرامۆش بکەن ؟! لەکاتێکدا خۆ ئێوە کتێبی خوا دەخوێننەوە، جا ئایا ژیریتان ڕێتان لێناگرێت لەو هەڵوێستە ناشرینە ؟!

لە هەردوو کتێبی صەحیحی ئیمامی بوخاری وموسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "يؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، فَيُلْقَى فِي النَّارِ ، فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ ، فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى ، فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ ، فَيَقُولُونَ : يَا فُلَانُ مَا لَكَ ؟ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ ، وَتَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ ؟ فَيَقُولُ : بَلَى ، قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلَا آتِيهِ ، وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ" - لە ڕۆژی قیامەت دا

---

١ البقرة: ٤٢ - ٤٤

كابرا دەهێنرێت وفڕێ دەدرێتە نێو ئاگرۆ، ڕیخۆڵەی نێو سکی شۆڕ ئەبێتەوە، وەك چۆن گوێدرێژ بە دەوری ئاش دا دەسووڕێتەوە ئاوا بە دەورییەوە خول دەخوات ! خەڵکی ئاگر لێی کۆدەبنەوەو دەڵێن: فلانی چییە ئەوە ؟ مەگەر تۆ نەبوویت فەرمانت بە چاکە دەکرد وڕێت لە خراپەو ناڕەوا دەگرت ؟! - کابرا دەڵێ: بەڵێ، فەرمانم بە چاکە دەکرد، بەڵام خۆم لێی نەئەدا، نەهیشم لە خراپە دەکرد بەڵام خۆم دەستم بۆی دەبرد.

ئەو کەسەی کە زانستی لە کۆڵ کردووەو کاریشی پێ ناکات، ئایەت ونیشانەکانی خوای پەروەردگاری لە بەرچاوە بەڵام خۆی لێ داماڵیون، خوای پەروەردگار بە گوێدرێژ نموونەی هاوردۆتەوە؛ بارە کتێبی لە پشتن بەڵام بارە کتێب بۆ گوێدرێژ هیچ سوودێکیان نییە .. نموونەی سەگێك هەردەم بە دوای دونیا وگومڕاییدا دەوەڕێتو هەمیشە لە باتیڵ ونەفامی وناحەقیدایە - جا چ بێیت ئامۆژگاریکەیت وئەو ئایەتانەی بۆ بێنیتەوە کە خۆی زۆر چاك ئەیانزانێت، چ بە غەیری ئەوان، چ لێتگەڕا - تازە بە ئەرزەوە چەسپاوەو مەیلی بەلاوە داوەو، خۆی لە گۆماوی شەیتان وەرداوەو پێی لەسەر ڕێبازی هەواو حەز وئارەزوو داناوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا ۚ بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ [١]- وێنەو سەر گوروشتەی ئەو کەسانەی تەوراتیان پێ هەڵگریراوەو لەبەردەرچوون وهەڵیان نەگرت، وەکوو نەقڵی ئەو کەرەیە کە چەند کتێبی لێ بارە. سەر گوزەشتێ نالەبارە بۆ ئەوانەی لە نیشانەکانی خودا حاشایان کرد وبە درۆیان خستەوە. خوداش ئەوانەی ناهەقن بەرەوخۆی شارەزاناکا وهیدایەت وڕێنموونیان نادا.

هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ ۝ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ ۚ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ

١ الجمعة: ٥

عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۚ فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [١]- دەنگ وباسی ئەو کەسەشیان بۆ وەخوێنە کە نیشانەکانی خۆمان پێ بەخشیبوو، خۆی لێبواردن؛ ئەوسا شەیتان وەدووی خۆیداو کەوتە ڕیزی گومڕایان ﴿﴾ ئێمە گەر بمانویستایە لەمانەڕا پایەبەرزیمان دەدایە؛ بەڵام ئەو هەر خۆی بە عەرزەوە چەسپاندو پەیڕەوی ئارەزووی خۆی بوو. نەزیلەو نموونەی ئەو وەکوو نەزیلەی سەگێکە بۆیبچی زمان دەردێنێو لێشی گەڕێ زوان دەردێنێ. ئەم چیرۆکە بەسەرهاتی ئەوانەیە کە نیشانانی ئێمەیان بەدرۆ دانا. تۆ لەو تەرزە باسانەیان بۆ وەگێڕە، شایەتا بیربکەنەوە.

ئیمامی قُرطُبي - ڕەحمەتی خوای لێبێ - لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێ: نموونەی ئەم ئایەتە لە تەواوی ئەو کەسانە دێتە جێ کە هەڵگری قورئانن وقورئانیان پێدراوە، کە چی کاری پێ ناکەن وبە ئەمر وفەرمایشتەکانی هەڵناستن.

---

١ الأعراف: ١٧٥ - ١٧٦

# سیفەتی دووەمی ئەهلی عیلم وزانست

## بریتییە لە حەق بێژی وڕوونکردنەوەی عیلم وزانست بۆ خەڵکی:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ۙ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾ [١]- بەڕاستی ئەوانەی کە بەرنامە و ڕێنمووییەکانی ئاشکرای ڕەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان ڕوون کردۆتەوە لە کتێبەکاندا، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەکات و نەفرین کارانیش نەفرەتیان لێدەکەن.

دیارە ئەوانەی ناویان بە زانست وزانیاری وعیلمەوە لکاوە، بەڵام لە جملەی ئەو کەسانەدان کە حەق وڕاستی دەشارنەوەو ئاشکرای ناکەن، لە دەستەو کۆمەڵی ئەو زاناو عالمانە نین کە ئەهلی ئاسمان وزەمین وتەنانەت حووتی ژێر دەریا ئیستیغفار وداوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکەن ! لەو زانا وشەرعناسانە نین کە شەریعەت ودەقەکانی شەرع ستایشیان دەکەن وئەجر وپاداشتیان نووسیون، بەڵکو لەوانەن کە خوای پەروەردگار ولەعنەتکاران لەعنەت ونەفرینیان لێ دەکەن.

پاڵنەری شەرعناس وخوێندکاریش لە شاردنەوەی حەق وئاشکرا نەکردنی دا پاڵنەری ترس ولەرزی دەسەڵات وهێز ومیدیاکانیانو، هیوای ڕازی بوونی تاغووتانە وبەدەست هاوردنی پلەو

---

١ البقرة: ١٥٩

پایەیانەو، پەرۆشی وخۆشەویستی دونیا وئارەزووەکانی ژیانە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ [١]- ئەوسا خودا بەڵێنی لەو کەسانە ساند کە کتێبیان بۆ هاتووە، بە مەردمی ڕاگەیێنن‌و نەیشارنەوە؛ کەچی ئەوان لە پەیمان پاشگەزبوونەوەو بە نرخێکی کەمیان فرۆت؛ ئای کە سەودای خراپیان کرد.

هەروەك فەرموویەتی: ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ۗ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ [٢]- ئەوسا جێنشینانێکیان هاتنە جێ، کتێبیان بە میرات بۆ مایەوە، کە هەر پەلاماری بەشی ئەم دونیایەیان دەداو بۆ تەماحی دنیا تێدەکۆشان، دەشیانگوت: ئێمە هەر زوو عافوو دەکرێین. ئەگەر دیسانیش بەشێکی وەك ئەویان بهاتایەوە بەر دەس وەریان دەگرت وگوێیان پێ نەبوو ودەیانماشایەوە. مەگەر لەو کتێبەدا لەوان پەیمان وەرنەگیرا، لە ڕاستی بەولاوە دەربارەی خودا نەخێون ؟ کە هەرچی تێشیدا هەبوو خوێندبوویان. ماڵی ئەولا بۆ ئەوانەی خۆپارێزن زۆر باشترە، هێشتا ئێوە تێناگەیەن ؟

بەڵێ چۆکیان لای زانایان داداوەو لە خوێندنگەکاندا خوێندوویانە، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَدَرَسُوا مَا فِيهِ﴾ - کە هەرچی تێشیدا هەبوو خوێندبوویان - ، بەلام هەروا چاویان لێ کردووەو، بڕواو ئیمانێکی پتەو وڕاستگۆیانە نەبووە لە دڵدا بچەسپێت .. وەك وەرگرتن وخوێندنەوەی هاوەڵان نەبووە، کە ئەهلی عیلم وزانست بوون ولە گەیاندنی دا ولە جیهادی دوژمنانی دا ئارامگر وبە سەبر بوون.

---

١ آل عمران: ١٨٧

٢ الأعراف: ١٦٩

ئیمامی اِبنُ القَیِّم - ڕەحمەتی خوای لێبێ - دەفەرمێ:

(هەر زاناو شەرعناسێك چاوی لە دونیا بێت وخۆشەویستی ژیانی لە دڵدا ڕوابێ؛ بێ گومان فەتواو حوكم وخەبەر وبڕیارەكانیشی بە ناحەق دەردەچن وبە نێوی خوای پەروەردگارە غەیری حەق وڕاستی لە پەڕاویدا تۆمار دەكات.

چونكە زۆرێك جار حوكمەكانی خوای پەروەردگار پێچەوانەی ویست وبەرژەوەندی خەڵكن، بە تایبەت لای ئەو دەسەڵاتدارانەی شوێن هەواو حەز وئارەزووەكانیانن؛ دیارە كە ئەو جۆرە كەسانە ئەگەر بە ڕووی حەقدا نەوەستنەوەو زۆرێك كات ڕەتی نەكەنەوە ویست وئارەزووەكانیان بۆ ناچنە سەر.

جا كە زانا وحاكم خۆشەویستی دەسەڵات وسوڵتەیان لە دڵدا بوو وڕێبواری هەواو حەز وئارەزووەكانیان بوون؛ چارەیەكی تریان نییە مەگەر كە حەقیان ڕێگر بوو لایدەن وبەسەریدا بپەڕن، بە تایبەت كاتێك كە شوبهەو گومانێكیان بۆ دێتە پێش وحەقەكەیان لا ڕوون نابێ، ئەو كات گومان وشوبهەو وحەز وشەهوەت دەگەنە یەكتر وهەواو ئارەزوو دەگاتە ئەوپەڕی، دی حەق وڕاستی لە بەرچاو ون دەبێت ودیار نامێنێت .. ئەوەو ئەگەر حەقەكەش ڕوون وئاشكرا بوو وهیچ گومانێكی تیا نەبوو، كابرا خۆی لێ لادەدات ودەڵێ: دوای تەوبەی لێ دەكەم وپەشیمان دەبمەوە !

ئەمانەو هاوشێوەیان خوای پەروەردگار باسی كردوون وفەرموویەتی: ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ [١] - لە دوای ئەوان كەسانێ بوونی جێگریان، كە نوێژەكانیان بەزایە داو شوێنی ئارەزووەكانی نەفسیان كەوتن، ئەوانە تووشی گومڕای و سەرگەردانی و سزا دەبن - هەروەها وەسفی كردوون: ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ

---

١ مریم: ٥٩

وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ۗ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، خوای پەروەردگار دەگێڕێتەوە ئەوان پەلاماری بەش وعەرەزی دونیایان داو دەسیان بۆ برد، سەرەڕای ئەوەی کە ئەیانزانی شتەکە حەرامەو ناشێ دەستی بۆ بەرن، بەڵام وتیان دەی خوا لێمان خۆشدەبێت ودەمانبووری ! ئەگەر بەشی دیکەی وەك ئەویشیان بێتەوە ڕێ دیسانەوە دەیماشنەوەو دەسی بۆ دەبەن، سووڕن لەسەر سەرپێچی وگوناهـ وتاوانیان). [1]قسەکانی هاتنە کۆتا – ڕەحمەتی خوای لێبێ.

بۆیە باس باسی لەبەرکردنی دەق ونووسین نییە وشەو ورۆژت لە خوێندنەوەو ومطالعەدا گرێدەی ! بەڵکو - تا لەو عیلم وزانستە سوودمەند بیت ولە خێر وبێرەکەی بێ بەش نەبیت - ئەشێ شوێنی دابەزینی ئەو زانست وعیلمە – واتا دڵ – پاك وتەمیز ولە خواترس وخۆپارێز بێت، کە دڵیش پاك وتەمیز وخاوێن بوو زانستەکە - بە کۆمەکی خوای پەروەردگار - سوودبەخش دەبێت وموسوڵمانانیش خێری ئەو زانستەیان پێ دەگات.

بەڵام ئەو کاتەی دڵی وەرگری زانست دڵی مونافیق ویاخود دڵێکی نەساغ وناتەندروست بوو، دیارە ئەو مرۆڤەش حەق وڕاستی پەردەپۆش دەکاتو درۆ بە دەمی خوای پەروەردگارەوە دەکاو دەبێتە کۆسپی سەر ڕێبازی خوای گەورەو، بە فەتواو قەوڵ وگوفتارەکانییەوە چەتری شەرعیەت بەسەر حوکمەتە بەکرێگیراوەکان دا هەڵدەدا، بۆ ئەوەی پاکانەی تاوانەکانیان دەرحەق بە ئیسلام وموسوڵمانان بۆ بکاتن.

---

١ (الفوائد: ١٤٥ – ١٤٦) – تحقیق: محمد عزیر شمس، سەرپەرشتی بکر عبدالله أبو زید، چاپ. المجمع

# سیفەتی سێیەمی ئەهلی عیلم وزانستیش ئەوەیە

## که ترسی خوای پەروەردگاریان بێت وخۆپارێز بن:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ [١]- ئاخۆ ئەمە دەگەڵ کەسێکا کە شەوگاران ڕوو بە خودا ڕاوەستاوەو سوژدە دەباو بەرفەرمانەو لە ڕۆژی سەڵا دەترسیٚ‌و هیوای وایە بەر بەزەیی پەروەرندەی خۆی بکەویٚ، وەکوو یەکە ؟ بێژە: ئاخۆ زاناو نەزان بەرانبەرن ؟ هەر ئەوانەی بە دڵ زیندوون دەتوانن بیرکەنەوەو سوود لەو یادەوەرییانە وەردەگرن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ [٢]- لە مەردمو جانەوەرو پاتاڵیشدا، هەر وەهایە، ڕەنگیان لە یەکتر جودایە. لە ناو عەبدانی خودادا هەر ئەوانەی کە زانان لێی دەترسن. خودا خاوەن دەسەڵاتی خەتاپۆش ولێخۆشە.

لەو بەڵگەو دەلیلانەی لەخواترسی وپارێزگاری حەق وڕاستەقینەی زانا وشەرعناس بۆ خوای پەروەردگار دەردەخەن؛ حەقبێژی وڕوونکردنەوەی عیلم وزانستە بۆ خەڵكو، ئامۆژگاری ئوممەتە، وبیٚ باکی زانایە لە لۆمەی لۆمەکاران، جا چ نەسڕانی وچ مورتەد وموونافیقان بن،

---

١ الزمر: ٩

٢ فاطر: ٢٨

وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾ [١]- ئەو كەسانەی فەرمانەكانی خودا دەگەیێنن‌و لەو دەترسن؛ غەیرەز خوداش لە هیچ كەسی تر ناترسن. خودا خۆی بەسە حەسێبگەربێ ولێبپرسێتەوە.

هەروەك بەڵگەی دیكەی لە خواترسی وپارێزگاری زانا وشەرعناس ئەوەیە كە بە جیهادەوە هەڵسێت لە پێناو خوای پەروەردگار تێكۆشێت وجیهاد بكات، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿أَلَا تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝ قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾ [٢]- ئاخۆ ئێوە بەگژ ئەوانەدا ناچن كە لە سوێند پاشگەزبوونەوەو نیازیان وابوو پێغەمبەر لەناو خۆ دەركەن؛ دەس پێشكەریش [لە شەڕیدا] ئەوان كردیان ؟ بۆ ئێوە لەوان دەترسن ؟ ئەگەر باوەڕوو هێناوە بۆ لێ‌ترسان خودا لەوان هێژاترە ۝ ئێوە دەگژیان ڕابچن؛ خودا هەر بە دەستی ئێوە ئەوان تووشی ئازار دەكاو ژێریان دەخاو سەرووەخا بەسەریان‌داو كارێك دەكا كوڵی دڵی باوەڕداران دابمركێ.

كە زانا حەقی شاردەوەو ئامادە نەبوو بە نەفس ومالْ وزمانییەوە جیهاد بكات، لە كاتێكدا كە لەشكری خاچپەرستان چەندەها وڵاتی موسوڵمانانیان تەنیوەتەوە، بێ گومان ئەم بە ناو زانایە لە كۆمەڵی ئەو زانایانە نییە كە خوای پەروەردگار لە كتێبی خۆیدا ستایشی كردوون‌و وەسفی لەخواترسی وكەماڵی خۆپارێزی داونەتە پاڵ.

---

١ الأحزاب: ٣٩

٢ التوبة: ١٣ - ١٤

**لێرەشدا کۆمەڵە کۆسپ وبەربەستێك بوونیان هەیە کە بەری تاڵیبی عیلم دەگرنو ناهێڵن ڕوو لە خاکی جیهاد بکات وبۆی دەرچێت:**

## یەکەمی ئەو کۆسپ وبەربەستانە:

### خۆشویستنی دونیا ومەیلە بەلایەوە:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ [1]- بێژە: ئەگەر بابو کوڕو براو ژن وخزمەکانوو وئەو ماڵەی پەیداوکردووەو بازرگانییەك دەترسن لەبرەوکەوێ وبازاڕی نەمێنێتو خانووبەرەی رندو دڵخۆشکەرەی خۆتان، پێ لە خوداو پێغەمبەرو جیهاد کردن لە ڕێی خوادا گرینگتر وخۆشەویسترە، چاوەنۆڕبن تا فەرمان لە خوداوە دێ. ئەوانەی لەڕێلادەرن، خودا شارەزا وڕێنموونییان ناکات وهیدایەتیان نادا.

دیارە کە یەکێك لەو هۆکارانەی کۆسپن لەبەردەم بەندەدا ناهێڵن جێپەنجەی لە جیهاد دا هەبێت، ئەم هەشت خۆشەویستەی مرۆڤن؛ کە بریتین لە: باوك، مناڵ، برا، خێزان، کەسوکار وعەشیرەتو، ئەو پووڵ وپارەی بە دەستی هێناون، وئەو بازرگانییەی ترسی هەیە لە جیهاد دا بەشدار بێ بازاڕی نەمێنێ - هەمان شت وەزیفەت کە ترسی هەیە لە دەستیچێت

١ التوبة: ٢٤

- وئەو ماڵ ومەسکەنەی دڵی پێ خۆشەو عادەتی پێگرتووەو هەر لەوێدا پێگەیشتووەو گەورە بووە، بۆیە زۆری پێ زەحمەتە ماڵئاوایی لێ بکات ولێی دووربکەوێتەوە.

بۆیە تەنها کەسانێك کە ڕاستگۆن ولە خۆشەویستی خوای پەروەردگار دا درۆیان نەکردووەو، بە قسەو گوفتار وبە کردارەکانیان تەوحید ویەکخواپەرستیان لە خۆدا بەرجەستە کردووە؛ بەسەر ئەم بەربەستانە تێدەپەڕن وکۆچ وجیهاد لە پێناو خوای گەورە دا دەکەن.

چونکە ئەوەی کە چاوی دوژمنانی لە ئوممەت سوور کردۆتەوەو ودەرگای بۆ واز کردوون دەست لە ئوممەت وخێر وبێرەکانی والاکەن خۆشویستی دونیا وڕقی ڕۆڵەتانی ئوممەتە لە شەڕ وجەنگ وقیتالەوە ..

هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "يُوشِكُ الْأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الْأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا ، فَقَالَ قَائِلٌ : وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ ؟ قَالَ : بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ ، وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ ، وَلَيَنْزَعَنَّ اللَّهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ ، وَلَيَقْذِفَنَّ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهْنَ ، فَقَالَ قَائِلٌ : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، وَمَا الْوَهْنُ ؟ قَالَ : حُبُّ الدُّنْيَا ، وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ" [١]

- دوور نییە ئوممەتان لێتان کۆبنەوەو ڕووتان تێبکەن، هەروەك چۆن کۆمەڵە نەفەرێك لە خوانە نانێك کۆدەبنەوە، کەسێك گوتی : بۆ چونکە ئەو ڕۆژ کەمین ؟! فەرمووی : نەخێر؛ بەڵکو ئەوڕۆژە زۆرن، بەڵام وەك پووش وپەڵاشی سێڵاو وان، خوای پەروەردگار هەیبەت وترستان لە دڵی دوژمنانتان دەردەکات و(وَهَن – لە زماندا واتا زەعیفی ولاوازی) لە دڵتاندا دەخات،

١ سنن أبي داود: ٤٢٩٧

یەکێك گوتی : ئەی پێغەمبەر خوا؛ (وَهَن) چییە ؟ فەرمووی : خۆشویستنی دونیا وڕقبوونەوەیە لە مردن !

لە ریوایەتی ئیمامی ئەحمەد دا [١]فەرموویێتی: "حُبُّكُمُ الدُنْيَا وَكَرَاهِيَتُكُمُ القِتَال" - خۆشویستنی دونیا وڕق بوونەوەتانە لە شەڕ وقیتال.

## کۆسپی دووەم

### هەڵەکانی خوێندن ودیراسەتن:

یەکێك لە هەڵەکان ئەوەیە خەمی خوێندکار کۆکردنەوەی بابەت ومەسەلە بێت وهەردەم پەرۆشی لەبەرکردن وزۆرکردنیان بێت، کە مەجالی تاعەت وعیبادەت وخێر وچاکە بۆ خۆی نەهێڵێتەوەو، لە پێشبڕکێی خێر وچاکەدا دواکەوێت، ولە زۆرێك لە بەش وپلەو پایەکانی بڕوا وئیمان دا بێ بەش بێت، کە سەرەنجام تووشی لاوازی ئیمان ونەخۆشی دڵ دێ.

ئیمامی اِبنُ القَيّم - ڕەحمەتی خوای لێبێ - لە تەفسیری ئایەتی ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُر﴾ - پێشبڕکێو بۆ فرەیی (ماڵ ومنداڵ ... هتد) ئێوەی بە خۆیەوە خافڵاند - دەفەرمێ:

(تَكَاثُر لەسەر وەزنی تَفَاعُل هاتووە کە لە زۆری وفرەیی‌یەوەیە. واتە هەر یەکتان هەوڵدا لەوی دی زۆرتر خڕکاتەوە. ئەوەشی باس نەکردووە کە مرۆڤ پێشبڕکێی کۆکردنەوەی دەکا وحەز دەکا لە کەسانی تر زۆرتری بێت، بەڵکو هەروا بە ڕەهایی لێیگەڕاوە کە؛ هەر شتێك

---

[١] مسند أحمد: ٨٥١١

مرۆڤ به دوایوه بێت وهەوڵدا زۆرتری ئەو شتەی لە هەگبەدا بێت - بێجگە لە گوێڕایەلی وتاعەتی خوای پەروەردگار وپێغەمبەرەکەی وئەوەی لە ئاخیرەت دا مایەی خێر وسوودن بۆی - هەموو مانای تَكَاثُر دەیانگرێتەوە. جا هەر شتێك بێ؛ چ پارەو پووڵ وچ پلەو پایەو جێگاو ومەکانەت وچ دەسەڵات وچ ژن وچ حدیث وفەرموود وعیلم وزانست، گشتیان دەچنە ژێر بابەتی تَكَاثُرەوە، بە تایبەت کە شتەکە پێویست نەبوو .. هەروەك بابەتی تَكَاثُر پێشبڕکێی خڕکردنەوەی کتێب ونووسین وخڕکردنەوەی بابەت ومەسەلەو وردەکاری ولق وپۆپەکانیان وزۆرکردن لەو مەسەلەش دەگرێتەوە) - قسەکانی کۆتایان هات. [١]

هەڵەی دیکەی خوێندن ئەوەیە؛ کە دەبینی خوێندکار پەرۆشی عیلمە وچاوی لە پاداشت وگەورەیی زانست وکار کردنی مرۆڤە بە زانستەوە، واتا گەیشتن بە پلەی صدّيقيّة [٢]، کە حەقەو وایە، بەڵام خەبەرداری ئەوە نییە کە کەسێك پشت لە جیهادی واجب بکات ناگاتە پلەی ڕاستگۆیی وڕاستگۆیان، چونکە وازهێنانی مرۆڤ لە جیهاد نیشانەی ئەوەیە کە نەگەیشتۆتە تەواو ڕاستگۆییو سیدقەکەی هێشتا لاوازە ! بە جیهاد ولە جیهادیشدا ڕاستگۆ ودرۆزن دەردەکەون کە کامەیان لە بڕواو ئیمانیدا ڕاستی کردووەو کامەیان درۆزن وناڕاستن، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ [٣]- خاوەن باوەڕ ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەری هەیەو تووشی دوودڵی نەبوونو بە گیان وماڵ لە ڕێی خودا تێکۆشاون وجیهادیان کردووەو هەر ئەمانە بەڕاستیانەو ڕاستگۆن.

---

١ الفوائد: ل ٣٠

٢ شیخ عبد الرحمن بن ناصِر السّعدی - ڕەحمەتی خوای لێبێ - لە تەفسیر دا (ل ٨٤١) ئەفەرمێ: صِدّيق ئەو خەڵکەن کە پلەو مەرتەبەکانی ئیمان وکرداری چاك وعیلمی بە سوود ودڵنیابوون ویەقینی ڕاستگۆیان لە خۆدا کۆکردۆتەوەو کامڵیان کردوون.

٣ الحجرات: ١٥

# سێیەم کۆسپ وبەربەرست

## هەڵەی پەروەردەکار وپێشەنگی خوێندکارانن:

یەکێك لەوانە نەگەیاندنە جێی فەرزی پەروەردگارە کە داوای لێکردوون وفەرمانی پێکردوون هانی خوێندکاران - وموسوڵمانان بە گشتی - بدەن لە جیهاد دا بەشدار بن وتێکۆشن‌و، گەورەیی وفەزڵ وپێویستی جیهادیان بۆ ڕۆشنکەنەوە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى اللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ وَاللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا﴾ [١] - کەوایە لە پێناو خوادا بجەنگە، تۆ هەر ئەرکی خۆت لەسەرە، هانی باوەڕدارانیش‌دە، ئومێدە خوا گورزی کافران وهێز وتینیان بشکێنێت‌و، خودا لەوان بەگوڕترەو لە بەڵابەسەرهێنانیش لەوان بە دەستوبردترە.

هەروەها لە هەڵەی پەروەردەکاران؛ ئەوەیە بانگخواز ڕێیەکی بۆ خۆ دەستنیشان کردبێ هیچ هۆیەکی هێز وئامرازی شەوکەت ودەسەڵاتی پێوە نەبێ‌و، نیازیشی بێ هەردەم لەم ڕێیەوە ئیسلام ودینی پەروەردگار سەرخات؛ واتا لەو سنوور ومەرزانەی حوکمەتە بەکرێگیراوەکان مۆڵەتیان داوە .. هەمیشە لەم ڕێگەدا بێ کە دوورە لە ڕێی جیهاد وتێکۆشانەوە ! کە لە ڕاستیدا لەم بەڵای بەسەر ئوممەە هاتووەو لەم جەنگە خاچپەرستییەدا هەر تەنها جیهادە تاکە ڕێی ڕزگاری وئازادی وسەرفرازی ئوممەتە.

---

١ النساء: ٨٤

ئەم ڕێبازە - خاڵی لە جیهادەی - گرتوویەتییە بەر، باکی بەوە نییە ئاسایش وئارامی تێکچێت وجەنگ بەرپابێت وڕووبەڕوو بوونەوەو شەڕ وترس ولەرز بێتە پێش، هەر ئەمەو هەر ئەوە ڕێباز وڕێچکەیەتی قەت بەرینادات ! هەر چەند بارودۆخ گۆڕانی بەسەردا بێ .. نەخێر بەڵکو تەلاشی ئەوەش دەدات تەواوی ئوممەت لەم هەڵبژاردە ناڕاست وهەڵەیدا بە دوایوە بن وپێ لەسەر پێی ئەوا دانێن !

ئەو خۆی وشوێنکەوتوانی لەم شەڕ وڕووبەڕوو بوونەوەیە دەرکردووەو، ئەوەندەی لە دەستی بێ ئەوەیە لە دوورەوە تەماشای شەڕەکە بکا ولێی خەبەردار بێ، ڕازییە لەو کەسانە بێ کە خوای پەروەردگار باسی کردوون وفەرموویەتی: ﴿يَحْسَبُونَ الْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا ۖ وَإِن يَأْتِ الْأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنبَائِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا فِيكُم مَّا قَاتَلُوا إِلَّا قَلِيلًا﴾ [١]- وا ئەزانن کە دوژمنە هاودەسەکان نەڕۆیشتوون. خۆ ئەگەریش ئەو هاودەسانە بێنەوە، ئەمانە ئاوات ئەخوازن دەگەڵ عارەبە چۆڵنشینەکاندا بانو هەر دەنگوباسی ئێوەیان بپرسیایە. خۆ ئەگەر لە ناوتانیش بان شەڕیان نەدەکرد، مەگەر کەم.

هەڵەی تری پەروەردەکاران واز هێنانیانە لە جیهادو، هاوسێیی کردنی نەسرانی ومورتەدەکانە لە قسەو گوفتار وزاراوەو دەستەواژەکانیان دا؛ وەك "ئازادی" و"دیموکراسی" وتا کۆتای ئەم لیستی دەستەواژەیە .. ئەو دەستەواژانەی جوانکراون وڕازێنراونەتەوەو لە میدیاو کەناڵەکان دا بڵاوەیان پێ دەکرێت وبانگەشەی بۆ دەکەن؛ ئەمانیش مەیلیان داونەتێ وفریوخواردووی ئەو دەستەواژە ڕازاوەنە بوونە، کەوا کەسانی بێ باوەڕ بە ئاخیرەت ودوارۆژ فریوی ئەو قسانە دەخۆن وبە دوایان دەکەون، وخۆیان پێ لە چەندین گێژاوی تاوان وگوناهەوە وەردەدەن.

ئەوانی قسەش دەڕازێننەوەو خەڵکی پێ هەڵدەخڵەتێنن بۆ ئەوەی لە دین وئیسلامیان پاشگەزبنەوە، خوای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە کە ئەمانە شەیتانی مرۆڤ وجنۆکەن

---

١ الأحزاب: ٢٠

ودوژمنی پەیامبەر ونێردراوانی خوان، هەروەك فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ۝ وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ﴾ [١] - ئێمە بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمنێكمان - لە نێو شەیتانەكانی بنیادەمو جندۆكە - داناوە. هێندێك لەوان - بۆ فریودان - قسەی ڕازاوەو درۆ بە هێندێكتر ڕادەگەینن. پەروەرندەت ئەگەر حەزی بكردایە، ئەو كارەیان بۆ نەدەكرا. لێیانگەڕێ با هەر درۆیان هەڵبەستن ۝ تاكو ئەوانەی بڕوایان بەو دونیا نییە، دڵیان مەیلی پێ بداو، پێی ڕازی بن، وبۆ ئەوەی ئەو تاوانانە بكەن كە ئەوان بەردەوام دەیكەن.

جا كەوایە چۆن زاناو شەرعناس قبووڵیەتی فریوخواردوویان بێتو، لە ژێر ڕكێفی كەناڵ ومیدیای ئەوان دا بێتو، دووركەوێتەوە لە ڕێی حەق بێژی تەواو وكامڵەوە، بۆ ئەوە نا حەق وڕاستی ڕوون وئاشكراو تەواو ڕۆشنكاتەوە، بەڵكو بۆ ئەوەی حەق وناحەق تێكەڵی یەك بكاتو لەگەڵ برێك دەستەواژەو لەفزیاندا بسازێت وموافەقەتیان بكات.

لە كۆمەڵی ئەو دەستەواژانەی هەن، "ئازادی"یە، واتا ڕەها بوونی مرۆڤ لە دەستگرتنە دین وڕەوشت وئەخلاقەوە - لە لێكدانەوەی نەسڕانی وعەلمانییە مورتەدەكان دا - واتا دژایەتی ئەسڵی گوێڕایەلی خوا وپێغەمبەر ﷺ وياخی بوونی مرۆڤ لە بەندایەتی خوای پەروەردگار، كە ئازادی شەیتانەكانی مرۆڤە؛ ئەمریكا وشوێنكەوتەكانی دیموكراسی وئازادییەكەیان.

كە لێشی ورد دەبییەوە ڕاست بڵێی ئەوان ئازاد نین، بەڵكو بەندەو گیرۆدەی شەیتانەكانی جنۆكەن وسەربازی ژێر فەرمانیانن، بەرەو دژایەتی وجەنگی خواو پێغەمبەركەیان بەرێ

---

١ الأنعام: ١١٢ - ١١٣

دەکەن، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾ [١]- تۆ نەتزانی ئێمە شەیتانەکانمان ناردۆتە سەر کافران ختووکەو هانەیان دەدەن ؟

هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾ [٢]- کەسێك خۆی لە ئاستی قورئان ویادی خوای میهرەبان کوێرکا، ئێمە شەیتانێك دەکەینە ملۆزمی وهەردەم دەبتە یار ویاوەری ولەگەڵیدا دەبێت.

هەروەك چۆن لە بەندایەتی خوای پەروەردگار یاخین، ئاوا کەوتوونەتە بەندایەتی هەواو حەز وئارەزووەکانیانو، بەندایەتی شەیتان وبەندایەتی ئەو مرۆڤانەی یاسا وڕێساو دەستووری دەسکردی مەخلووقیان دەخەنە بەردەس ... تا دوای ئەو تاغووت وکوفرانەی تووشی بەندایەتی وبەردایەتییان هاتوون.

ڕاستی ئەوەیە کە مرۆڤ تەنها بە یەکخواپەرستی ودینداری ڕاستەقینەی بۆ خوای گەورە لە بەندایەتی تاغووتەکان نەجاتی دەبێت. ئیسلام کە هاتووە ئازادییەکەی غەربو ڕۆژئاوای بە خۆوە نەهێناوە، بەڵکو ئەوەی هاوردوویەتی بەندایەتی خوای پەروەردگارە، چونکە بەندایەتی کردن مەبەستی خوای پەروەردگار بووە کە خەڵکی دروست کردووەو بەدی هێناون، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ [٣]- من هەر بۆیە جندۆکەو مرۆم دروس کردووە، بمپەرستن - دیارە کە پەروەردگار بۆ ئەوەی دروست کردووین ئەو بە تەنها وبێ هیچ هاوەڵ وهاوبەش وشەریکێك بپەرستین.

---

١ مريم: ٨٣
٢ الزخرف: ٣٦
٣ الذاريات: ٥٦

كە زانا هاتو لە ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا گفتوگۆی مورتەد ومونافیقانی كرد ومەبەستی ڕەزاو قبووڵی خوای پەروەردگار بوو، دیارە هەم لە گوفتار وهەم لە بانگەواز ومەنهەجیدا حەق دەپێكێت وتووشی ڕێباز وكۆسپ وتەڵەی گومڕایی نایەت.

بەڵام كە لە مەبەست وئامانجی بوونی بوونەوەر غافڵ بوو، وكەوتە ڕازیكردنی ئەم خوێنەر وئەو بینەرە - جا چ نەسرانی بن وچ عەلمانی ومونافیق - دیارە كە ناپێكێتو ڕێچكەیەك دەخاتە نێو بەرگی دینی خوای پەروەردگارەوە كە لێی غەریب ونامۆیە، وەك ئەو هەموو دەستەواژە ڕازاوەی نەسرانییەكان؛ "ئازادی" و"دیموكراسی" و"مافی مرۆڤ" ... هتد.

كەواتە واجبی زانایانە لە ڕیزی برا موجاهیدەكانیان بنو سەریانخەن، نەوەك پاكانەو ماستاو بۆ كافران ومونافیقانی دوژمنانی خوای پەروەردگار بكەنو، تانەو تەشەر لە موجاهیدان بدەن بۆ ئەوەی خۆیانی لە كافران پێ نزیككەنەوە.

چون كاتێك زانا نەرمی بەرامبەر دوژمنانی خوا نواند وخۆی لە موجاهیدان وساڵحان جوێ كردەوە؛ وردە وردە هەم خەڵكی دەوروپشتی خۆی دەدۆڕێنێ، وهەم تازە ڕێی هێز وعیزەت وجیهادی لە قیس چووە، واتا بانگەوازەكەی دۆڕاندووە وهێزی خۆی شكاندووەو زەلیلی بەردەستی كافران وحوكمەتە بەكرێگیراوەكان بووە، كەواتە لەم بەینەدا .. نە لە ڕیزی موجاهیدانە بەشداری جیهادیان بێت وسەریانخاتو، نە لەگەڵ حوكمەتە مورتەدەكانیشە كە ئەوانیش تەواوی بانگەواز وڕێبازەكەیان قبووڵ نییە.

كە زاناو شەرعناس گەیشتە ئەم ڕادەی شكست ولاوازییە، كافران ومونافیقانیش كێشەی تیا نابینن لە میدیاكانیان دا پێشوازی لێ بكەن، كە تازە برێكی تەنازول كردووەو لە قسەی خۆی هاتۆتە خوار ! خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا

إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ۝ وَلَوْلَا أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ۝ إِذًا لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا﴾ [١]- هێندەی نەمابوو ئەمانە لەو فەرمانەی - کە ئێمە پێمان ڕاگەیاندبووی - کلاتکەنو شتێکی تریان بۆ بێنیو درۆ بە زاری ئێمەوە هەڵببەستی؛ کە ئەوسا دەبوونە دۆستت ۝ ئەگەر خۆمان تۆمان توند ڕانەگرتایە، لەوانەبوو کەمێك بە لای ئەواندا بێی ۝ ئەگەر واشبا، سوور بزانە هەر لە ژیندا دووقات جەزرەبەو سزامان دەدای؛ لە مەرگیشدا ئازارەکەت دووسەرەبوو. ئەوسا کەسیشت نەبوو - لەسەر ئێمە - بێتە هانات وسەرتخا.

هەروەك فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ ۝ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ [٢]- بەوەی خوا بۆی دابەزاندووی ئا بەوە داوەرییان لە نێواندا بکەو بە دووی هەواو حەز وئارەزوویان مەکەوە، چاوت لێبێ وبە ئاگا بە نەکا هەڵەتکەن ولە برێکی ئەو ئایەت وفەرمایشتانەی بۆمان ڕەوانە کردووی وەرتگێڕن وشوێنیانکەوی. ئەگەر هەر ڕوویان وەرگێڕا، سا بزانە کە خودا نیازی وایە لە بەرانبەر بازێك لە گوناهەکانیان تۆڵەیان لێبکاتەوە، زۆربەی زۆریش لەو مەردمە لەڕێ دەرچوون ۝ ئاخۆ حوکمی جاهیلییەت ونەفامییان گەرەکە ؟! بۆ کەسانێ کە دڵنیان ویەقینیان هەیە [٣] چ حوکمێ لە حوکمی خوا جوانتر وڕێکوپێکترە ؟!

---

١ الإسراء: ٧٣ - ٧٥

٢ المائدة: ٤٩ - ٥٠

٣ ئیمامی طَبَرِي – ڕەحمەتی خوای لێبێ – لە تەفسیر دا دەفەرموێ: خوای پەروەردگار وا دفەرمێ؛ چ حوکم وبڕیارێك لە حوکمی خوا چاکتر وجوانترە، ئەگەر دڵنیان خوایەکتان هەیەو، ئەهلی یەکخواپەرستی بن ودان بە پەروەردگار دا بنێن ؟

اِبنُ كَثِير - ڕەحمەتی پەروەردگاری لێبێ - لە تەفسیر دا دەفەرمێ: هەر کەس لە خوا گەیشتبێ چ شەرعێکی داناوەو، بڕوای بەو بێتو بزانێ ودڵنیابێ پەروەردگار باشتر لە هەموو فەرمانڕەوایەك بە کار ڕائەگاتو لە هەمووان ڕێکوپێکتر ودروستترەو، دایك چەندە بەزەیی بە کوڕی خۆی

ئەوەندەی زانا وشەرعناس بۆ ئوممەت بەسە لەسەر حەق وجیهاد خۆڕاگر وجێگیر بێت .. با لە کونجی زیندان دا دەستبەسەر بێت وڕێگەی بانگەوازی لێگیرابێتو لە ماڵەوەش بەسرابێتەوە .. وتەیەکی حەق وپارچە کاغەزێکی زانا بگاتە دەستی ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە ئامۆژگاری وهاندانی ڕۆڵەکانی بێ جیهادکەن وتێکۆشن؛ هەر ئەوەندە کافییە ئوممەت بە دەم بانگەوازەکەیەوە بێن ولە دەوریدا کۆبنەوە.

بەڵام کە لە حەق وحەق بێژی وجیهاد دا جێگیر نەبوو، ونەرمی بەرامبەر دوژمنانی خوا نواند، بانگەوازەکەی دۆڕاندووە. با لەولاوە ئامرازی بانگەواز ومیدیای زۆری لە بەردەستدا بن، کە ئوممەت متمانەی پێ نەماوە هیچ سوودێکیان نییە.

بۆیە واجب وئەرکی خوێندکارانی شەرعی وگەنجان - وهەر مەردێکی بە توانا - ڕووکردنە جیهاد وسەرخستنی براکانیانە لە خاك ومەیدانەکانی جیهاد دا، تا کۆمەڵ ودەستەیەکی کافی لە ئەهلی عیلم وموجاهیدان پێکدێن ئەرك وجیهادەکەیان پێ بچێتە سەر.

هەروەك ئەرکی موسوڵمانانە بە ماڵ وسامانیان لە پێناو خوای پەروەردگاردا تێکۆشن وجیهاد بکەن وبرایانیان سەرخەن، ولە ژێر فشاری نەسرانی ویەهوود وبەکرێگیراوانیان لە ناوچەکەدا نەشکێن، کە هەوڵ وتەلاشی ئەوەیانە جیهادی ماڵ وسامان لە موسوڵمانان قەدەغەکەن.

... دیتەوە ئەو ئەوەندەی تر بەزەیی بە خەڵقی خۆی دیتەوە، کە لە هەموو شتێك بە ئاگایەو، بەسەر هەموو شتێك دا زاڵە ولە تەواوی شتەکان دا عادل ودادگەرە = بۆ کەسێ وا حاڵی بێتو دڵنیا بێ کێ لە حوکم وبڕیاریدا لە پەروەردگار دادگەر وعادلترە ؟!

## بۆ برایانی موجاهیدیشمان له عێراق

## وەسیێتمان وایه؛

که ڕیزەکانیان له ژێر یەك سەرکردایەتیدا یەکخەن و، وشان به شانی هێزی سەربازیدا لایەنێکی سیاسی ومیدیاییان هەبێت ڕووی له موسوڵمانان بێت ومەبەست وئامانجی جیهادیان بۆ ڕۆشنکاتەوه - که پیادەکردنی دینی خوای پەروەردگاره له عێراق - وموسوڵمانان به دەوری ئەم مەبەستەدا کۆکاتەوه.

هەرچی دەستگرتنه لایەنی سەربازیشه بێ له لایەنێکی سیاسییەوه؛ لەوانەیه جیهادەکه به سوودی سەرکرده عەلمانییه مورتەدەکان تەواو بێت وسەرەنجام ئەوان دەست بەسەر حوکم ودەسەڵاتی عێراقەوه بگرن.

داوا له خوای پەروەردگار دەکەین موجاهیدان له هەر کوێیەك بن سەریانخات وپشتیوانیان بێت.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

٢٩ رمضان ١٤٢٤ كۆچی